# سوننەی سیاسی
# لە دروستکردن و ڕاپەڕاندنی دەسەڵاتدا

نوسینی: محمد مختار الشنقيطي
وەرگێڕانی: ئیسماعیل تەها

# سوننەی سیاسی
# لە دروستکردن و ڕاپەڕاندنی دەسەڵات دا

.............................................................

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ (٥)

**نووسینی:** محمد مختار الشنقيطي
**وەرگێڕانی:** ئیسماعیل تەها
**دیزاین:** ڕەوشت محەمەد
**چاپخانە:** تیشك

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە(١٨٢٩)ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

## پێشەکی

### بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

لـەو سـاتەوەی قورئـانی پیـرۆز دابـەزیـوە، باشـترین جێبەجێکار پێغەمبەری خوا (صلی اللـه علیه وسلم) بـووە، پرسـی شـوراش یـەکێکـە لـەو پرسـە گرنگانـەی بـەردەوام قـسەی لـەسـەر کـراوە، (مـحەمەد موختـار شـەنقیتـی) خوێنـدەوەیـەکـی جـوانی بـۆ ژیـانی پێغـەمبـەر کـردووە، بەشێکی لەو رووداوانە کۆکردۆتەوە، کە پێغەمبـەر (صـلی الله علیه وسلم) چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئایـەتـی: (وشـاورهم فـي الأمـر)، (وأمـرهم شـوری بیـنهم) کـردووە، هـەروەهـا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رەچاوی چـی کـردوە لـە پێدانی بەرپرسیارێتی، ئەوە وا دەکات بڵێین: خوێندەوەی ژیانی پێغەمبـەر یارمـەتیدەرێکی باشـە بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەو پرسـیارانەی رووبـەڕووی موسـڵمانان دەبنـەوە، بەپشت بەستن بە ژیانی راستەقینەی پێغەمبەر (صلی اللـە علـیە وسـلم) زۆر گومـان دەرەوێـتەوە و زۆر تـەفـسیر

هەڵدەوەشێتەوە، زۆر ماف بۆ خاوەن ماف دەگەڕێتەوە، بەم خوێندنەوەیە دەگەین بەو ئەنجامەی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مرۆڤێکی کامڵ بووە، لە ژیانی دەوڵەتداری زۆر لێهاتووانە مامەڵەی لەگەڵ هاوەڵان کردووە، کاتێک کەسێکی لە شوێنێک داناوە دانانەکەی لە شوێنی خۆی بووە.

هەر ئەم خوێندنەوە شایستەش بوو ئێمەی هاندا، کە ئەو نووسینە وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی، بە ئومێدی سوودلێوەرگرتنی.

**وەرگێڕ**

## چەند نامەیەکی بەردەست

**إذا هـم ألـقى بيـن عـينيه عزمـه**
**ونكب عـن ذكـر الـعواقب جـانبا**
**ولـم سـتشر في أمره غير نفسـه**
**ولم يرض إلا قائم السيف صاحبا**[1]

بیشری کوڕی ناشب بەم جۆرە شانازی بەگوێنەدان بە سەرئەنجام دەکات، راوێژی هەڵوەشاندۆتەوە، پەنای بردۆتە بەر مەنتیقی هێز، بەڵام ئیسلام لە کاروباری گشتی تێڕوانینێکی جیاوازی هەیە، بنەماکەی شورا، دادپەروەری، ئازادییە، بەرژەوەندی کۆمەڵێکی ئیماندار بەسەر تاکێکی خۆبەدەسەڵاتزان دەدات، ئامانج لە نامیلکەی یەکەم لە (نامیلکەی فیقهي سیاسي) بەشداریی کردنە لە روونکردنەوەی بنەماکانی ئیسلامی، کە

[1] ــ ئەم دوو بەیتە هی سەعدی کوری ناشبە لەسەر قسەی مێژوونووسانی ئەدەب بڕوانە: ابن قتيبة: الشعر والشعراء ١|١٤٩، هەرچەندە (التنسيبي) بەیتی یەکەمی داوەتە پاڵ (مالک بن الريب)، سەیری: (التنيسي: المنصف للسارق والمسروق منه، ص ١٣٦) بکە. وە ئەم دوو بەیتە (أبو حيان) لە تەفسیری ئایەتی (المشاورة)دا هێناویەتی. أبو حيان: البحر المحيط ٤١/٣ .

دروستکەرە بۆ بنیاتنانی دەسەڵات و جێبەجێکردنی لەمیانەی بەدواداچوونی هەندێک لەوانەی لە سوننەتی پێغەمبەر، خەلیفە راشیدیەکان هاتووە لە پێشینەکانی سیاسی لەم بوارە.

هەوڵدەدەین لەرێگای بەگۆهێنانی ئەم دەقانە، هەندێک وەڵام هەڵێنجین لەبارەی ئەو گرفتانەی رووبەڕووی بەم بوارانە دەبنەوە، وەک:

* پێوەری شایستەیی سیاسی لە ئیسلامدا.

* جیاوازی نێوان راوێژ و ڕاگۆڕینەوە.

* کێن ئەوانەی فەرمان بە راوێژکاری و ڕاگۆڕینەوە دەیانگرێتەوە.

* ئەندازەی پابەندی و پێڕاگەیاندن لە شورا و ڕاگۆینەوە.

* دانانی راوێژکاری لە شوێنی خۆی.

* دیاریکردنی ئەهلی زانست و بەئەزمون لە شوێنی تایبەت بەم فەرمانە.

* رەچاوکردنی زۆرینە، بۆ یەکلاکردنەوە لە کاتی راوێژکاری.

* مافی ئافرەتی مسوڵمان لە بەشداری کردنی لە راوێژدا.

ئێمە ویستی ئەوەمان نییە وەڵامی تەواو لەسەر هەموو ئەو گرفتە زانستییانە پێشکەش بکەین ـ بەڵکو ئەوە بۆ کەسانی شایستەی خۆی جێ دەهێڵین ـ ئەمە تەنها هەوڵێکە بۆ ئاشکراکردنی هەندێک لایەن لە نموونەی ئیسلامی لە بنیاتنانی دەسەڵات و جێبەجێکردنی، بەو ئومێدەی ببێت بە توێشوویەک بۆ ئەوانەی کار لەسەر بنیاتنانی دەسەڵاتی شەرعی لە وڵاتانی ئیسلامی دەکەن، لەگەڵ ئاوڕدانەوەش لەوانەی گرنگی دەدەن بە سیاسەت بە تیۆری و پراکتیکی لەگەڵ دەوڵەمەندی سوننەی پێغەمبەر لەم بوارە و پێویستی هەڵێنجان لە سوننەت و شوێن پێهەڵگرتن بە دوای سوننەتی پێغەمبەر.

## فەرمانڕەوا کرێگرتەیە (إن خير من إستأجرت)

ئەبو موسلیمی خەولانی چووە لای معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ـ رەزای خوای لێبێت ـ پێی لەنێوان دوو پۆل بوو، پێی گوت: السلام عليكم ئەی کرێگرتە، خەڵکەکە گوتیان ئەوە چ دەڵێی!! معاویە گوتی لێی گەڕێن ئەو خۆی شارەزاترە لەوەی کە دەیڵێت، لەوەڵامدا گوتی: وعليكم

السلام ئەی ئەبوو موسلم، پاشان ئامۆژگاری کرد و هانی دا لەسەر دادپەروەری[1].

ئەمە مانای ئەوەی نییە کە تابعی یەمانی زاهید ـ کە وشەی کرێگرتەی ـ بەکارهێنا گەمەی بەم وشانەکردووە، یاخود بەم وشانە دەستدرێژی بکاتە سەر فەرماندەکەی، بەڵکو ئەوە لە دیدێکی ئیسلامی راستەقینەبوو بوو، جوانی پێوەندی نێوان دەسەڵاتدار بە گەلەکەیەوە بووە، ئەمە پێوەندی بەکرێگرتە و خاوەنی کاربوو، ئوممەت خاوەنی کارە، فەرمانڕەوا کرێگرتەیە بۆ ئوممەت، دانراوە بۆ جێبەجێکردنی کارەکەی، لەپێناو پاداشتێکی مادی دیاریکراو و پایەکی مەعنەوی بەمەرجگیراو، پابەند بەگرێبەستێکی دوولایەنەی سەرپشک، ئەمانەت و دڵسۆزی لەلایەن فەرمانڕەوا، گوێڕایەڵی و یارمەتی لەلایەن ژێردەستەکانەوە.

لەوکاتەوەی کە فەڕمانڕەوا کرێگرتەی ئوممەتە، پێویستە هەردوو سیفەتی ئەماننەت و هێزی تێدابێت، کە قورئان ستایشی کرێگرتە دەکات لەسەر زمانی کچەکانی

---

[1]ـ الذهبي: سير أعلام النبلاء: ٤/١٣.

شوعەیب (إن خیر من استأجرت القوي الأمین)[1] ئەمانەت سیفەتە ئەخلاقییەکان دەگرێتەوە و باڵادەستی فەرمانڕەوا ڕەت دەکاتەوە و ڕێ لە ستەمکاری دەگرێت، ڕێگری لە دەروونی دەکات دەسەڵات و سامان کاری تێ بکات، یان خراپ بەکاریان بێنێت، جا بە هەرجۆرێک بێت، هەرچی هێزیشە ئەزموونی سیاسیی و سەربازی و هونەری دەگرێتەوە، کە دەبێتە هۆی چەسپاندن و جێبەجێکردنی ئەرکەکەی بە جوانترین شێوە، کە باشترین بێت بۆ ئوممەت.

**پێکەوەبوونی ئەمانەت و هێز لە ناو خەڵکدا کەمە**

واباوە لە ناو گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەسانێک هەبوون ئەمانەت و هێزیان تێدا هەبووە، لەوانە عومەری کوڕی خەتاب، کە پێغەمبەر وەسفی کردووە بە: (بەهێز و ئەمینە، لەپێناو خوا لە سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران ناترسێت)، لە دواییدا دەقی فەرموودەکە بەدرێژی دەهێنین، لەوانەش عەتابی کوردی ئەسید، کە لە فەرمودەی ئەنەس هاتووە: پێغەمبەر (صلی

[1] ـ القصص، الایة: ٢٦

الله علیه وسلم) کردی بە فەرمانڕەوا لەسەر مەککە، توندبوو لەسەر ئەوانەی گوماناوی بوون، نەرم بوو لەسەر ئیمانداران[1].

عومەری کوڕی ئەبو عەقرەبەوە دەڵێت: گوێم لە عەتابی کوری ئەسید بوو، کە پشتی بە بەیت دابوو، دەیگوت: (والله ما أصبت في عملي هذا الذي ولاني رسول الله إلا ثوبين معقدين كسوتهما مولاي كيسان)[2]

هەروەک کۆمەڵێک لە هاوەڵان بەئەمانەت بەناوبانگ بوون بە واتا سیاسییەکەی، کە لێرە مەبەستمانە، لەوانە ئەبوو عوبەیدەی عامری کوڕی جەراح، کە پێغەمبەر ناوی نابوو (ئەمینی ئومەت) کردبویە والی نەجران، لە حوزەیفەوە گێردراوەتەوە، گوتویەتی: عاقیب و سەید کە خاوەنی نەجران بوون، هاتن بۆ لای پێغەمبەر هاتن بۆ مولاعەنە، یەکیان گوتیە ئەوەی تر ئەوکارە مەکە، سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەر بێت، بە لەعنەتمان بکات نە ئێمە و نە ئەوانەی دوای ئێمەش دێن سەرکەوتوو نابین، جا گوتیان بە پێغەمبەری خوا: هەرچی داوا بکەیت پێت

[1] ـ إبن حجر الإصابة ٤٣٠/٤

[2] ـ إبن حجر الإصابة ٤٥١ وقال: إسناده حسن.

دەدەیـن، بەڵام پیـاوێکی ئـەمینمـان لـەگـەڵ بنێـرە، جگە لە ئـەمـین کەسـیترمان لەگەڵ مەنێـرە، پێغـەمبـەر فـەرمـووی: کەسێکی ئەمینتان لەگەڵ دەنێرم، کە بەڕاستی ئەمین بێت، پێغەمبەر فەرمووی هەستە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، ئـەبـو عوبـەیـدەش هـەسـتا، لـەوکاتـەی هـەسـتا پێغـەمبـەر فەرموو ئەوە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە.[1]

بـەڵام ئـەو ئـەمانـەت و هێـزە زۆر کـەم لـە کـەسـێک کۆدەبێتەوە، ئەگەریش کۆبـۆوە، کـەم وایـە بـە هاوسـەنگی رابگیرێت، ئـەمـە کرۆکی ئـەو کێشـەیـە، کـە شـێخ الإسـلام ئیبن تەیمیە باسی دەکات: کۆبوونەوەی هێز و ئەمانەت لە خـەڵـک کـەمـە، بۆیـە عومـەری کـوری خـەتـاب دەیگـوت: سـکاڵای لای خـوا دەکەم سـتەمی خراپـەکـار و دەستەپاچەی متمانە پێکراو).

بۆیەش کاتێک خالیدی کوری وەلید کـە مـسولڵمان بـوو پێغەمبەر بواری سـەربازی پێ سـپارد، لـەگـەڵ ئـەوەی کـە هەندێک جار هەندێک کاری دەکرد پێغەمبەر پێی نـاخۆش بـوو، تـەنانـەت جارێـک دەسـتی بـەرزکـردەوە بـۆ ئاسـمان فـەرمـووی: (اللهـم إنـي أبـرأ إليـک ممـا فعـل خالـد) خوایـە

[1] البخاري ٤|١٥٩٢ وابن ماجه ١|٤٨

بەریم لەو کارانەی خالید ئەنجامی دەدات، ئەبو زەڕی غیفاری پیاوێکی راستگۆ و ئەمانەتپارێز بوو لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر پێی فەرموو: ئەی ئەبو زەڕ من تۆ دەبینم لاوازی، فەرمانڕەوایەتی دوو کەس مەکە، سەرپەرشتی ماڵی هەتیو مەکە[1].

لەم دەقە شیکارییە ئیبن تەیمیە دوو نمونە دەهێنێتەوە لە سەر هاوسەنگی ئەمانەت و هێز لە دوو لەگەورەکان، نمونەی یەکەم خالیدی کوڕی وەلیدە، هێز بەسەریدا زاڵە، زەهەبی وەسفەکەی بە جوان و شایستە زانیوە، کە پێی گوتراوە: سیف الله، سوارچاکی ئیسلام، شێری بینراو[2]، بەڵام خاوەن هێزێکی سەرکەش بوو، بەسەر ئەمانەتەکەیەوە، ئەمە وای کردبوو لەکاتی کوشتنی هۆزێک پێغەمبەر خۆی لەم کارە بەری بکات، هەر ئەمەش بوو عومەری کوڕی خەتاب سەرزەنشتی لەسەر

---

[1] ـ ابن تيمية: السياسة الشرعية ١٦-١٧ وحول حديث :"اللهم إني أبرأ إليك ..." انظر البخاري ١٥٧٧/٤ و٢٦٢٨/٦ وصحيح ابن حبان ٥٣/١١ والبيهقي: السنن الكبرى ١١٥/٩ والنسائي: السنن الكبرى ٤٧٤/٣، وعبد الرزاق: المصنف ١٧٤/١ أما حديث :"يا أبا ذر ..." فقد رواه مسلم ١٤٥٧/٣ والبيهقي في الكبرى ١٢٩/٣ وفي شعب الإيمان ٤٥/٦ والنسائي في الكبرى ١١٢/٤ وفي المجتبى ٢٥٥/٦ والبزار ٤٣٥/٩

[2] الذهبي: سير أعلام النبلاء ٣٦٩/١

مـاليکی کـوڕی نـوەیـڕە بکـات، پاشـان دووری بخاتـەوەو بڵێت: لە شمشێری خالید خوێن ڕشتن هەیە[1].

ئـیبن تـەیمیـە پێـی وایـە خالـد بێفـەرمـانی پێغـەمبـەری نەدەکرد، بەڵکو گوێڕایەڵ بوو، بـەڵام خالید لـە شـارەزایـی لـە دیـن پلـەی وەک هـاوەڵانـی تـر نـەبـوو، لـە حکـومی ئەو بابەتە شـارەزا نـەبـوو، هـەروەهـا گـوتراوە: لـە سـەردەمـی پێش ئیسلام نـاکۆکی هـەبـووە، ئـەمـە وای لـە خالید کـرد جەنگیان لەگەڵ بکات[2].

نمونـەی دووەم: ئـەبـوو زەڕی غیفارییـە، کـە پێشـەنـگ بـوو لـە زوهـد و خواناسـی و راسـتگۆیی و پـاکی، بـەڵام پێغـەمبـەر ڕێگربـوو لـەوەی بـەرپرسـیاریەتـی وەربگرێت، ئەویش هۆکارەکەی ئەوەبوو کـە ڕەهـەنـدێکی گرنگـی تێدا نـەبـوو، ئـەویـش شایـستەیـی سیاسـییە بە چاوپۆشـین لە زوهـدەکەی، چونکـە ئـەمانـەت بـەبـێ هێـز بەس نیـیە تـا کـارێکی شایستە بـەڕێوە ببـات، هێـزیش بـەبـێ ئـەمانـەت نابێت.

---

[1] ابن الجوزي: المنتظم في تاريخ الملوك والأمم ٥/
[2] ابن تيمية: منهاج السنة ٤/٤٨٧

ئیبن تەیمیە نمونەیەکی تر دەهێنێتەوە لەسەر هاوسەنگی نێوان هێز و ئەمانەت، ئەویش عوسمانی کوڕی عەفانە، کاتێک ئەمانەت زاڵبوو بەسەر هێزی، هەندێک خەڵک چاویان بڕییە لایەنی لاوازی، ئیبن تەیمیە دەڵێت: عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت): ئەو کارەی لەسەر دڵنەرمی و نەرمونیانی و ڕەحم و سەخاوەتەوە بنیات نابوو، هەروەها هێز و سیاسەتی عومەری کوڕی خەتابی نەبوو، بۆیە هەندێک کەس تەماحیان تێیکرد و کەوتنە دنیا کۆکردنەوە، هەندێک لە کەسە نزیکەکانی ماڵ و دەسەڵاتی خستنە بەردەست، بەهۆی ئەو خزمایەتی و نزیکیەوە، هەندێک کار ڕوویدا کە خەڵک لێی ناڕازی بوو، ئەوەبوو لە ویستی هەندێک خەڵکی دونیاویست و لاوازی لە خواترسانیان و ترسیان لەویش نەبوو لەبەر لاوازی، ئەوەبوو لەکۆتایی ئەو ئاژاوەی لێ دروست بوو تاوەکو خۆی بە ستەملێکراوی شەهید بوو[1].

**لێزانی و یەکترتەواوکردن، هاوسەنگی دەپارێزن:**

کۆنەبوونەوەی ئەمانەت وهێز لەزۆربەی خەڵک کیشەیەکی کردەییە، دەکرێت سوک بکرێت لەمیانەی یەکتر تەواوکرد لێ و لێزانیدا، لێزانین: دەرککردنی

[1] ـ منهاج السنة ٤٥٢/٧

مولابەســاتی پــلە و دەســەلات و پەیوەســتبوونیەتی بە کەسانێکی دیاریکراوەوە، بەبێ ڕەچاوکردنی شـارەزایی تایبەتیـان، ئـەمـەش بـە هـەڵێنجـانی کردنـە فـەرمـانڕەوای ئوسامەی کوڕی زەید لەلایەن پێغەمبـەرەوە دەردەکەوێت بۆ جەنگی رۆمەکـان، هەرچەنـدە ئەو لە ڕووی ئەزمـوونی جەنگی و شارەزایی سیاسییەوە لە ئاسـتی گەورە پیـاوانی موهـاجیر و ئەنسـاردا نەبـوو، بەڵام پێغەمـبەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) (بەرەو ڕوو دوژمنێکـی نـارد کە باوکیـان کوشـــتبوو، کاتێـــک لەوەدا بەرژەوەنـــدی بینـــی)[1]، بەرژەوەنـدییەکەش زیـادە پاڵنەرێـک بـوو لە ئوسـامەدا بـۆ شەڕەکە، جگە لەو پاڵنەرە گشتییە کە لە دەروونی هەمـوو ئیمانداریکدا هەبوو، وا دەردەکەوێت پێغەمـبەر (صـلی اللـه علیه وسلم) ئەم مەبەستەی لە پێشترەوە هەبووە (قەیسی کوڕی حازم دەڵێت: کاتێک کاتێک پێغەمبەری خوا هەواڵـی پێگەیشت کە لە موئتەدا ئالای سوپا دراوەتە دەست خالید فەرمــووی: بــا بــدرایە بە کەســێک بــاوکی کوژرابــوو، مەبەستی ئوسامە بوو)[2].

---

[1] ـ منهاج السنه، ٢٧٩/٤.

[2] ــ الذهبي: سير أعلام النبلاء، ٥٢/٢

ئـەوەی تـەواوکارییـە، بریتییـە لـەوەی فـەرمـانرەوا راستگۆ بێت لەگەڵ خوا و گەلەکەی، ئاگاداری لایەنـەکانی بەهێزی و لاوازی خۆی بێت، لەناو گەلەکەی بگـەرێت کـە کـێ ناتـەواوی و کـەموکوڕییـەکـانی ئەوی پـێ تـەواو دەکرێت، با حاکمـەکـەش لـە ئـەهلـی ئـەمانـەت و هێز بێت، چونکە هاوسەنگی رەها تێرو تەواوی رەهایـە، ئـەوەش لـە مرۆڤ بەرجەستە نابێت، بۆ ئەمە ئیبن تەیمیـە شـیکاریەک دەکـات لـە دانـانی خالـد لایـەن ئـەبوبـەکر و دانـانی ئـەبـو عوبـەیدە لـەلایـەن عومـەرەوە، دەڵێت: (عومـەری کـوڕی خـەتـاب تونـد بـوو لـە بـەرامبـەر سـنورەکـانی خـوا، ئـەبـو عوبـەیدەە دانـا، چـونکە نـەرم بـوو، ئـەبوبـەکر نـەرم بـوو خالید توند بوو بەرامبەر کـافرەکـان، کـەسـی تونـد کـەسـی نەرمی دانا، کەسی نەرم کەسی توندی دانا، بەمـە کـارەکـە هاوسەنگ بۆوە، هەردووکیان کارێکیان کرد خوای گەورە پێی خۆش بێت)[1].

ئەگـەر فـەرمـانڕەوا هێزێکی لـە دەروونـی خـۆی بـەدی دەکرد، توانایی هەبوو لـەسـەر چـاودێری و لێپرسـینەوەی ژێـردەسـتەکـانی دەتوانێت شـارەزایـان لـە شـوێنی خـۆی

[1]ـ ابن تیمیة: مجموع الفتاوی ٤٥٥/٤

دانــێ، هەرچەنــد ئاســتی ئــەمانــەتیــان لاواز بێــت، بــە پشتبەستن بەو کارەی عومەری کوڕی خەتاب ڕەزایی خوای لێ بێت، (عومەری کوڕی خەتاب ئەگەر کەسێک کەمێک خراپەشی هەبوایە دایدەنا لەبەر بەرژەوەندی کارەکەی، پاشان بەهۆی هێز و دادپەروەریەکەی خراپەکەی وازلێدەهێنا)[1].

ئەم لــۆژیکی لێزانــی و تەواوکــاریە بــوو پــاڵی بە ئەبوبەکرەوە نا تا دەستبگرێت بە خالیدی کوری وەلیدەوە لە کاتی هەڵگەڕانەوەی عەرەب، کاتێک تیرەکانیان لە یەک کــەوانەوە ئاراســتەی ئیــسلام دەکــرد، لــەگــەڵ ئــەوەی ئەبوبەکر ڕەخنەی لە خالید هەبوو، لەوانە خوێنڕێژی شمــشێرەکــەی، دەســتکاریکردنی دەســتکەوتــی جــەنــگ، ســەرپێچــی خــەلیفــە، کاتێــک مــاڵێکی دەســت دەکــەوت لــە جەنگ بەسەر ئەهلی غەنائیمی دابەش دەکرد، حیسابەکەی بۆ ئەبوبەکر نەدەناردەوە، هەندێک کاری دەکرد ئەبوبەکر ئاگاداری نــەبــوو)[2]، بــەڵام ئــازایەتی لــە جــەنــگ ڕێــی بــە ئەبوبەکر نەدا دووری بخاتەوە، ئەوەبوو کە ڕووبەڕووی

---

[1]ـ ابن تيمية: الخلافة والملك، ص ٣٦

[2]ـ ابن حجر: الإصابة ٤١٤/١

جەنگی هەڵگەڕانەوە بووەوە، هەستی بەوە کردبوو کە لە لایەنی سەربازی بە لای خالید زاڵە لەسەر نەیارەکانیدا، بۆیەش (کاتێک عومەر ئاماژەی بە لادانی کرد، ئەبوبەکر گوتی: کێ شوێنی خالیدم بۆ دەگرێتەوە).[1]

**راوێژ و پرس و ڕا بە یەکترکردن پارێزەرن لە کەوتن:**

کاتێک لێکۆڵینەوە لە نەوەکانی یەکەم دەکرێت، لاوازی مرۆڤ و کەموکوڕی خۆڕسکیت بۆ دەردەکەوێت، چونکە کۆبوونەوەی هێز و ئەمانەت ئەستەمە بە هاوسەنگیەکی رەها راگیرێن، بەڵام هەستی واقیعی بوون شایەتی ئەوە دەدەن و دەبینی کە فەرمانڕەواکانیان لە ئاستی میللەت راستگۆبووینە لەگەڵ خوا و گەل، کەواتە ئەی چارەسەری کردەیی چییە بۆ ئەو گرفتە کە خۆی دەبینێتەوە لە کۆنەبوونەوەی هێز و ئەمانەت؟

ئیسلام جوانترین چارەسەری کردەیی پێشکەش کردووە، ئەویش دەسەڵاتی گەلە بە هەردوو بنەمای راوێژ لە دانانی دەسەڵات و پرسیپێکردن لە جێبەجێبکردندا، جا لەسەر بنەمای شورا ئوممەت

---

[1]ـ هەمان سەرچاوەو لاپەرە

باشـترین خـەڵـک هـەڵـدەبژێرێـت کـە هـەردوو سـیفەتـی ئـەمانـەت و هێـزی تێـدا بێـت، ئیـسلام هـیچ بـژاردەیـەکـی پێشوەخت فەرز ناکات بەهـۆی زۆرکـاری یـان میراتیـەوە، بە ڕاگۆڕینەوەش گەل فەرمانڕەوای لاوازی بەهێز دەکات و جڵەوی فەرمانڕەوای بەهێزیش دەگرێت، مـافی خۆیـشی دەیارێزێــت بە لادانــی هەریەکێکیــان یــان گۆڕینیــان بە شیاوتر.

بنــەمــای شــورا لە قورئانــدا لــە وەســفی ئیمانداڕانــدا هاتووە کە دەفەرموێت: (وأمرهم شورى بينهم)[1]، بنـەمـای ڕاگۆڕینەوەش لە فەرمانپێدانی پێغەمبەردا هـاتووە، خـوای گەورە ئەمری پێدەکات: (وشاورهم في الأمر)[2]، ئـەوەی لـە قورئــان بــەکــورتی هــاتووە لــە ســوونـنەتی سیاســی پیغەمبەردا بەدرێژی هاتووە، بە قسە و بە کـردەوە، بـەڵام واچـاکترە لـە ڕووی میتـۆدەوە جیـاوازی بکـەیـن لـەنێـوان ڕاوێژ و ڕاگۆڕینەوە، ڕاوێژ پەیوەستە بە بوونی دەسەڵات و شــەرعیــەتپێــدانی هەر ڕاگۆڕێنــەوە پــەیــوەســتە بــە جێبەجێکردنی دەسەڵات و بەڕێوەبردن و هەنگاونانی، ئەم

---

[1]ـ شوری: ٣٨.
[2]ـ أل عمران: ١٥٩.

جیاوازیـه مـەنهـەجیـە لـەسـەر ئیعتیبـاری شـەرعـی و زمانەوانی بنیاتنراوە.

له لایەنی ئیعتیباری شەرعییەوە ڕاگۆڕینەوە لە قورئان هاتووە کە فەرمانی بە پێغەمبـەر کـردووە (وشـاورهم في الأمـر) هـەرچـی راوێـژە لـە سـیاقی فـەرمـوودەی قورئـانـدا هـاتووە لـە بـارەی ئیمانـدارانەوە کـە (وأمـرهم شـوری بینهم)ە، پێغەمبـەر فـەرمـانی پـێ نـەکراوە بـە راوێژکـردن، بەڵکو فەرمانی بە ڕاگۆرینـەوە پێکـراوە، بەڵام بـە گـوێرەی دەق ئیمانداران فەرمانپێکراون بە راوێژکردن، هەروەها بە ناڕاسـتەوخۆش ئەمریـان بە ڕاگـۆڕینەوە پێکـراوە وەک چاوکردن لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

سـودی ئـەمـە جیاکردنـەوەیـە لـە نێوان راوێژکـردن و ڕاگۆرینەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەران پێشەوایەتیان لـە گـەل وەرنـەگرتـووە، بـۆیە پێویستیان بـە راوێژکـردن نییـە لـەو شـتانەی کـە پـەیـوەسـتن بـە بنیاتنـانی دەسـەڵات و شـەرعیـەتەوە، چونکـە شـەرعیەتـی سیاسـی پێغـەمبـەران بابەتێکی عەقیدەییـە، گوێڕایـەڵیان گوێڕایـەڵی خوایـە: (من یطع الرسول فقد أطاع الله)[1]، بەیعەتدان پێیـان بـەیعـەتـە بـە

---

[1] ـ النساء: ٨٠

خوا، خوای گەورەش دەفەرموێت: (إن الذين يبايعونک إنما يبايعون الله)[1].

مافی پێغەمبەران لە سەرکردەیی کارێکە لەرووی عەقیدەوە کۆتایی هاتووە، ئەوە پێدانێکی خواییە نەک لەلایەن خەڵکەوە، بۆیە خوای گەورە بە داود دەفەرموێت: (يا داود إنا جعلناک خليفة في الأرض)[2].

لە چیرۆکی ئیبن لەتبیەی ئەزدی بەڵگەیەکی روون هەیە لە نێوان شەرعیەتی سیاسی پێغەمبەران وخەڵکانی تردا، هەروەک لە چیرۆکەکەدا هاتووە، (کە پێغەمبەر هەستا وتاری بۆ خەڵک دا، سوپاسی خوای کرد، پاشان گوتی: من خەڵکانێک لەسەر هەندێک کار دادەنێم لەو کارانەی کە خوای گەورە منی لەسەر کردۆتە فەرمانڕەوا، کەچی یەکێک دێت دەڵێت: ئەمە بۆتۆیە، ئەمەش بە دیاری پێم دراوە، جا ئەگەر لە ماڵی دایک و بابی خۆی بۆ دانیشێت تا هەدیەی بۆ بێت، ئەگەر راست دەکات[3].

لە ریوایەتی تر هاتووە، (دوای سوپاس و ستایش دەبێ هۆی چی بێت ئێمە هەندێک خەڵک هەیە

[1] ـ الفتح: ١٠
[2] ـ ص: ٢٦
[3] ـ البخاري ٢٦٣٢/٦

فەرمانڕەواییان دەدەینێ لەو فەرمانڕەواییەی کە خوای گەورە بە ئێمەی بەخشیویت)[1]، (پیاوێک لەئێوە دەکەمە فەرمانڕەوا لەسەر کارێک لەو کارانەی کە خوای گەورەی گەورە منی کردۆتە فەرمانڕەوا)[2]، (بەکاری دەهێنم لەسەر کارێک لەو کارانەی کە خوای گەورە منی دامەزراندووە)[3]، پێغەمبەر فەرمانڕەوایەتی خۆی گەڕاندۆتەوە بۆ خوا، نەک خەڵک، بەمەش روون دەبێتەوە، کە تیۆری (دانەپاڵ خوا) کە پاداشاکانی ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاست بانگەشەیان بۆ دەکرد، لە ئیسلامدا بۆ پیغەمبەران تیۆرێکی دروستە، بەڵام بۆ غەیری پێغەمبەران دروست نییە، چونکە فەرمانڕەواکان ڕاستەوخۆ ڕەوایەتی خۆیان لە خەڵک وەردەگرن، نەک لە خوا، هەر بانگەشەیەک بەناو خواوە بۆ وەرگرتنی دەسەڵات بریتییە لە فێڵکردن لە خەڵک بوختانکردن بە خوای گەورە.

بەڵام لە ئیعتیبـاری زمانەوانیـدا: کە جیـاوازی نێـوان ڕاوێـژ و پـرس و ڕا لەسـەر بنیـات دەنرێـت سـیغەی

---

[1] ـ ابن حبان ٣٧٣/١

[2]ـ أبو عوانة ٣٩١/٤

[3] ـ عبد الرزاق ٥٤/٤

(صـرفی) و دەنگەکەیەتـی: لە بـواری سـەرفیدا (الـصرف) بنەمـای (فعـل)ەکە لەسـەر کێـشی (فاعَـلَ) بێـت، دەبێـت چاوگەکەی لەسـەر کێشی (فِعال) بێت، وەک (قاتَـلَ، قِتـالاً)، یـان لەسـەر (مُفاعَلَـة) بێـت وەک وەک (شـاور، مـشاورة) (وشـاورهم فـي الأمـر)، لەسـەر (مـشاورة) دادەنرێـت نەک (شوری) واتە: پرس و ڕا نەک ڕاوێژ.

بەڵام ڕیتمـی دەنگی، هەرچەنـدە ڕیشەی زمانەوانییـان هاوبەشـە، بەڵام بێـژەی (شـوری) ئامـاژەیە بە مانـای کـرانەوە و دەستاودەسـتی بـێ سـنوور لە نێـوان چەنـد لایەنێکـی دیـارینەکراوی ژمـارە و سـیفەتدا، ئەمەش دەگونجێت لەگەڵ پرۆسـەی دامەزراندنی دەسـەڵاتێکدا کە هەموان تیایدا هاوبەشن. بەڵام بێژەی (المشاورة) ئامـاژە بـۆ دوانەیـی و دەستاودەسـتکردنێکی سـنووردار دەکـات، بـۆیە لەگەڵ پـرس و ڕای دەسـەڵاتدار بە ژمـارەیەکی دیـاریکراوی خەڵـک یـان خەڵکـی بە گـشتی لەسـەر کاروبارێکی سنووردار دەگونجێت، بەڵام پرۆسـەکە تەنهـا دوو جەمسەری هەیە.

مەبەستیـشمان لە بەکارهێنـانی ڕیتمـی دەنگـی لێـرەدا تەنها وەها حاڵیبوون (الانطباع) نییە، چونکە ڕیتمی دەنگی

بێژەکــانی قورئــانی پیــرۆز جارجــار مانــای تــایبەت دەگەیەنێـت، وەک لە جورجـانی و زەمەخـشەری لە زانـا پێـــشووەکاندا روونیــــان کــــردووەتەوە و لە زانـــــا هاوچەرخەکانیش سەید قوتب لێکۆڵینەوەیەکی چەسپاندنی ئەمەی پێـشکەشکردووە لە کتێبـی (التـصویر الفنـی فـی القرآن)، کۆمەڵێک تێڕوانینی وردی لەسـەر ئاوازی دەنگی هەندێک لە بێژە قورئانییەکان دەربڕیوە.

**راوێژکردن لە بیاتنانی دەسەڵات واجب و پابەندکارە**

زۆرجـار نـاکۆکی لـەسـەر ئـەوە دروسـت دەبێـت ئایـا راوێژکردن پابـەندییـە، واتـە: پێویستە فەرمانڕەوا پابـەند بێت بـە ڕای زۆرینـەی خـەڵک لـەو پرسـانەی کـە راوێـژی لـەسـەر دەکرێـت، یـان نـا؟، بـەڵام زۆر لەو جەدەلانە لـە سـۆنگەی تێکـەڵکردنـی ڕاوێژکــردن لــە دروســتکردنی دەســەڵات و ڕاگۆڕینــەوە لــە جێبــەجێکردنــی دەســەڵات کـەوتوونـەتـە هـەڵـەوە، ئـەمـەش سـەری بـۆ نـاڕوونی و شپرزەیی کێشاوە.

بەڵام لە سـۆنگەی ئـەم جوداکـارییەوە وێنـەکـە زیـاتر ڕوون دەبێتـــەوە، چـــونکە راوێژکـــردن پێـــوەنـــدی

بەدروستکردنی دەسەڵاتەوە هەیە و پێویستە پێوەی پابەند بین، ئەگەر پابەند نەبین مەدلولە شەرعی و بەرهەمە بەرژەوەندییەکەی لەدەست دەدات، هەموو دەقەکانی سوننەت لەم بابەتەدا دەلالەت لەسەر واجببوون لە سەرەتا و پابەندی لە کۆتایدا دەکەن، بەڵکو توندترین هەڕەشەشی تێدایە لەو کەسانەی لەریزی مسوڵمانان دەرچن دوای ئەوەی بۆچۆنیان لەسەر هەڵبژاردنی فەرمانڕەوایەک جێگیر دەبێت و بۆ دین و بۆ دنیایان پێی رازی دەبن، هەروەها هەڕەشە لەو کەسانە کراوە، کە دژی فەرمانڕەوای هەڵبژێردراوی مسوڵمانان پەرتەوازەیی دروست دەکەن، ئەمەش بەهێزترین دەستەواژەیە لەسەر پابەندێتی ڕاوێژکردن.

بۆیە یەکەم شت کە پێویستە ئاگاداری بین سووربوونی پێغەمبەرە لەسەر سەرپشککردنی ئومەتەکەی لە هەڵبژاردنی فەرمانڕەوادا، لە فەرموودە هاتووە، کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکم بە بێ راوێژ دابنایە، ئەوا ئیبن ئوم عەبدم دادەنا)[1]، لە ریوایەتێکی تر هاتووە، ئەگەر بەبێ راوێژ کەسێکم دابنایە

---

[1] ـ الطبراني في الأوسط ٣٥٩/٧ وفي الصغير ٩/٢

بۆ مسولّمانان ئیبن مەسعوودم دادەنا[1]، دەفەرموێت: (ئەگەر من فەرمانڕەوام بۆ ئومەتم دابنایە بەبێ راوێژکردن فەرمانم پێ دەکردن کە ئیبن ئوم عەبد دانێن)[2]، کە دەکاتە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود.

پێغەمبەر هەوڵی داوە ئامۆژگاری ئومەتەکەی بکات، بەڵام پابەندی نەکردووە بە هەڵبژاردنی کەسێکی دیاریکراو بیکات بە سەرکردەیان لە دوای خۆی، بۆیە علی کوری ئەبوو تالیب دەڵێت: گوترا ئەی پێغەمبەری خوا دوای تۆ کێ بکەین بە سەرکردەمان، فەرمووی: ئەگەر ئەبوبەکر بکەن بە فەرمانڕەوا، دەبینن کەسێکی ئەمین و زاهید و دونیانەویستە و حەزی لە دوارۆژە، ئەگەر عومەر بکەن بە فەرمانڕەوا کەسێکی بەهێز و ئەمینە لەپێناو خوا لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت، ئەگەر

---

[1] ـ رواه الحاكم في المستدرك ٣٥٩/٣ وقال: "هذا حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه" .

[2] ـ النسائي ٧٣/٥

عەلی بکەن بە فەرمانڕەوا ــ کە نابینم ئەم کارە بکەن ــ کەسێکی ڕێنیشاندەرە ڕێگای ڕاستتان پێ دەگرێت[1].

دەبینین پێغەمبەر لێرە بۆ ئوممەتەکەی کەسانێکی شایستە لە ڕۆڵەکانی دەپاڵێوێت، بەڵام ئازادی دەداتە دەست خۆیان، کە گەل خاوەنی (حەل و عەقد) و دانانی فەرمانڕەوا و لادانیەتی، هەروەک لە فەرموودەکەی پێغەمبەر روون دەبێتەوە، ئەگەر فڵان بکەن، فڵان بکەن.

بەکورتی لەم کارە پێویستە ئوممەت شوێن بنەمای شورا بکەوێت لە هەڵبژاردنی سەرکردە، پاشان سەرکردە پابەند بکرێت بە بنەمای پرس و ڕاگۆڕینەوە، بۆ ئەوەی سەرەتا و کۆتایی کارەکە بەدەست گەل بێت.

شیعە لە بانگەشەیان بۆ ئەم کارە زۆریان تێپەڕاندووە لەسەر ئەوەی دەق هەیە لە بۆ خیلافەتی عەلی، هەر لە خودی ریوایەتی عەلی وەڵامیان دەدرێتەوە، هەروەک هەندێک لە ئەهلی سوننە کە دەڵێن: دەق هەیە لەسەر خیلافەتی ئەبوبەکر، بەپشت بەستن بە فەرموودەی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت)، کە دەڵێت: (لە

---

[1]ـ الطبراني في الأوسط ٢٧٢/٦ والبزار ٧٣/٣ وأحمد ١٧/١. وانظر أيضا في اختلاف ألفاظ الحديث: الترمذي ٦٧٣/٥ وابن أبي شيبة ٣٨٤/٦ والبزار ٨٣/٣ وأحمد ٧٦/١ و٩٥/١

سەرەمەرگ پێغەمبەر بانگی کردم گوتی بانگی ئەبوبەکر و براکەتم بۆ بکە تا کتابێکیان بۆ بنوسم، چونکە من دەترسم کەسێک ئومێد بکات، یان کەسێک بڵێت: من شایستەترم، بەڵام خوای گەورە و ئیمانداران ئەمە رەت دەکەنەوە تەنها ئەبوبەکر نەبێت[1].

ئەمە بەڵگەیەکی راشکاوانەیە کە پێغەمبەر ئەم کارەی بۆ گەلەکەی جێهێشتووە، نەک بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە بیەوێت ئەم کتابە دەقێک لەخۆی بگرێت لەسەر دیاریکردنی ئەبوبەبکر، بەڵکو دەکرێت ئەم کتابە هەندێک بنەمای تێدا بێت لەسەر بەرێوەچوونی هەڵبژاردنی خەلیفە، ناوی خەلیفەی نەهێنابێت، وەک دەڵێت: خوای گەورە و ئیمانداران رەتی دەکەنەوە، بەڵگەیە کە هەڵبژاردنی ئیمانداران بۆ سەرکردەیان بنەمایەکی سەرەکییە، بەڵام تیایدا نەهاتووە کە لە کۆتاییدا هەڵبژدارنی دیاری کردبێت، ئەگەر حەزیشی کردبێت ئەبوبەکر هەڵبژێرن.

---

[1]ـ عبد الله بن أحمد بن حنبل: كتاب السنة ٥٤١/٢ وقال محققه د. محمد سعيد القحطاني: إسناده حسن" والمقدسي: الأحاديث المختارة ٨٦/٢ وقال محققه عبد الملك بن دهيش: "إسناده صحيح"، وذكر ابن حجر أن الحديث "في مسند أحمد بسند جيد"، انظر الإصابة ٥/٢

ئـەوەشـی کـە پـەیـوەسـتە بـە دروسـتکردنی دەسـەڵات لەسـەر راوێـژ، عومـەری کـوڕی خـەتـاب گوتوویـەتـی: (هەرکەسێک بەیعەت بدات بەبێ راوێژکردنی مسولْمانان، نە ئەو بەیعەتی داوە، نـە ئـەویش بـەیعـەتی وەرگرتـووە، دەبێـت بکـوژرێن)[1]. هـەروەهـا هـاتووە: (ئاگـاداربن هەرکەسێک بەیعەت بدات بـەبێ راوێژکردنی مسولْمانان، نە ئەو بەیعەتی داوە، نـە ئـەویش بـەیعـەتی وەرگرتـووە، دەبێت بکوژرێن)[2]، هەروەها هـاتووە: (کە پێم گـەیشتووە فلان گوتوویەتی ئـەگـەر عومـەری کوڕی خـەتاب بمرێت بـەیعـەت دەدەم بـە فـلان، هـەرکـەس بـەیعـەت بدات بـەبێ راوێـژ و ڕاگۆرینـەوەی لـە موسـڵمانان ئـەوەی بـەیعـەتی پێدراوە بەیعـەتی بۆ نییـە، ئـەوەشـی بـەیعـەتی داوە بۆی نییـە)[3]، بە قسەکەی عومـەر: (هیچ خیلافـەتێک نییـە بـەبێ راوێژ)[4].

لە وەسیەتـەکانی عومـەری کوڕی خـەتاب هـاتووە لـە سـەرەمـەرگـا، گـەورە و فـەرمـانڕەوایـانی سـەربـازی

---

[1]ـ مسلم ٤|١٨٥٧ وابن حبان ١٤|٥٦٤ والنسائي ٤|٢٥٣ والحاكم ٣|٥٤٢
[2]ـ البخاري ٢٥٥/٦ وعبد الرزاق ٤٤٥/٥
[3]ـ البزار ٣٢/١
[4]ـ ابن حبان ١٤٨/٢

کۆبوونــەوە: (لــە رۆژی ســێیەم، خــانەدان و بەرپرســە سەربازییەکان کۆبکەنەوە و کەسێک بکەن بە فەرمانڕەوا و هەرکەس بەبێ راوێژ بوو بە فەرمانڕەوا لە ملی دەن)[1]، لە ریوایەتێکی تر هاتوو: (پرس بە یەکتر بکەن و پاشان لە سێ ڕۆژدا قسەکانتان کۆکەنەوە، فەرمانڕەواکانی سەربازی کۆکەنەوە، جا هەرکەس بەبێ راوێژی موسڵمانان خۆی کرد بە فەرمانڕەوا لە ملی دەن)[2]. لە ریوایەتێکی تر هاتووە: (هەرکەس بەبێ راوێژی مسوڵمانان خۆی کرد بە فەرمانڕەوا لە ملی دەن)[3]، بەڵکو هۆشداریەکەی پێغەمبەر بەسە، کە لە (عەرجەفەوە هاتووە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو دەیفەرموو هەرکەس هات بۆ لاتان و کاروبارتان لەسەر پیاوێک یەک بوو، کەچی ئەو دەیویست ریزتان شەق بکات بیکوژن)[4]، ئاشکرایە بەبێ راوێژ مسوڵمانان لەسەر یەک کەس کۆنابێتەوە.

---

[1]ـ النسائي ٢٧٢/٤ وابن أبي شيبة٤٣١/٧
[2]ـ البيهقي في الكبرى ١٥١/٨
[3]ـ عبد الرزاق ٤٨١/٥
[4]ـ صحح إسناده ابن حجر، انظر فتح الباري ٨/٧

ئەم فەرمودە و وتانەی هاوەڵان بەڵگەیەکی روونە لەسەر واجبی راوێژکردن لەو کارانەی پەیوەستن بە بنەمای دەسەڵات و پابەندی بە ئەنجامەکەی، هەروەک بەڵگەن لەسەر ئەوەی دەسەڵاتی شەرعی گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی پیرۆزە، کە بەیعەتدانی سەرپشکیە بۆ زۆرینەی خەڵکی، هەرکەس پیرۆزی ئەو گرێبەستە کۆمەڵایەتیە هەڵبوەشێنێتەوە، خوێنی خۆی حەڵاڵکردووە.

هەرچی دەسەڵاتی ناشەرعیە ئەوە لەسەر بنەمای گرێبەست دروست نەبووە و هیچ بەها و حورمەتێکی نییە و پابەندی نییە لە گەردنی خەڵکدا نییە، بەڵکو کارێکی نەشیاوی نەگریسە، پێویستە بگۆڕدرێت.

عادەتەن کۆدەنگی بەمەرج نەگیراوە لە هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا، هەروەک ئیبن تەیمیە لە چەندین شوێن لە (منهاج السنە)دا باسی کردووە، بەڵکو تەنها بەدەستهێنانی زۆرینەی خەڵک بەسە، بەڵکو ئەمە کاری هاوەڵان بووە، چونکە لە بەیعەتی ئەبوبەکری صدیق سەعدی کوڕی عوبادە رەخنەی هەبوو لە ماوەی ژیانیدا، عەلی کوری

ئـەبوتاليب مـاوەی شـەش مانگ ڕەخنـەی هـەبوو پاشـان بەيعەتی دا، (لەم شەش مانگەدا بەيعەتی نەدا)[1].

بەڵام ئەمە كاريگەری نەبوو لەشەرعيەتی سـەركردەو واجبـی گوێڕايـەڵـی ئەبـوبەكری سـديق، هـەروەک لە هەڵبژاردنی عەلی كوڕی ئەبوتاليبدا ژمارەيـەک لـە گـەورە هـاوەڵان ڕەخنـەيـان هـەبوو، كـە كۆی گشتيان ـ حـەڤدە كەس ـ بوون، هەروەها ئەهلی شـام ڕەخنـەيـان هـەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا (خيلافـەتـەكـەی بـە ئيجمـاع دروسـت بـوو، ئەو خەليفەی سەردەمی خۆی بوو خەليفايەتی بۆ كەسی تر نەبوو)[2].

## ڕاگۆڕينەوە لە ڕاپەڕاندنی دەسەڵاتدا لە نێوان پايەندی و پێڕاگەياندندا:

ڕاگۆڕينەوەی پەيوەست بە جێبەجێكردن و ڕاييكردنی دەسەڵات، ئەمە لە سەرەتاوە واجبە، بەڵام ئەنجامەكەی ڕەنگە پابـەنديی بێت بـۆ سـەركردەی ڕاوێژكـار، يـاخود تەنها ئاگاداركردنەيە و ڕاوەرگرتن بێت، بەرلە برياردانی

---

[1] ـ البخاري ١٥٤٩/٥ ومسلم١٣٨/٣ وابن حبان ١٥٣/١١
[2] ـ النووي: شرح صحيح مسلم ١٤٩/١٥

خـودی خـۆی، سـوننەی سیاسـی دەلالـەت لـەسـەر ئـەوە دەکات کە پێغـەمبـەر هەمیشە پابـەند بووە بـە ئـەنجامی ڕاگۆڕینـەوە لـە کاروبـاری گـشتی تـەنهـا لـە دوو حاڵـەت نەبێت:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر وەحی بۆ هاتبێت لەلایەن خـواوە لەبارەی کارێکەوە، جگە لـە ملکـەچی هـیچ بڕیـارێکی تـری بۆ نەبووە، راوێژکردنی بۆ نەبووە بـە هـاوەڵـەکانی تـەنها پێڕاگــەیانــدنیان نــەبێــت و رازیکردنیــان نــەبێــت بـــە شــوێنکەوتنــی ئاراســتەی خــوای گــەورە لــەوبــارەوە، روونترین نموونە لەم بارەیەوە سـوڵحی حودەیبیەیە، کـە پێغەمبەر سووربوو لەسـەر رەتکردنـەوەی رای زۆرینـەی هــاوەڵان لــە دەســتپێکی (صــوڵحەوە)، هــەروەک لــەم چیرۆکەی ئوم سەلەمەوە روون دەبێتەوە:

هۆکــاری رەتکردنــەوەی ســوڵحی حــودەیبیــە لــە سـەرەتاوە ئەوەبوو (کە سـوهەیلی کـوری عـەمر مـەرجی دانـا ئـەم سـاڵ هەرکەسـێکمان بێـتە لای ئێـوە بـا لـەسـەر ئاینـەکـەشـت بـن، دەبێت بۆمـان بگێـڕیتەوە و ئـێمە و ئەو وازلێدەهێنێت، ئیمانداران ئەوەیان لە دڵ گران بوو، کەچی

سوهەیل سووربوو لەسەر ئەوە، بۆیە پێغەمبەر بۆی نووسی)[1].

عومەری کوڕی خەتاب دەنگی لە هەموو کەس بەرزتر بوو لە رەفزکردنی ئەم مەرجەدا، (عومەری کوڕی خەتاب هات بۆ لای پێغەمبەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئێمە لەسەر حەق نین و ئەوان لەسەر ناڕەوا نین؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، ئینجا گوتی: ئەی کوژراوی ئێمە لە بەهەشت نییە و کوژراوی ئەوانیش لە دۆزەخ؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، ئەی بۆچی سووکایەتی بە ئاینەکەمان قبوڵ بکەین؟ با بگەڕێینەوە، تا ئەو کاتەی کە خوا حوکم لە نێوان ئێمەو ئەوان دەکات، پێغەمبەر فەرمووی: ئەی کوڕی خەتاب من پێغەمبەری خوام، خوای گەورە من نافەوتێنێت[2]. لە ریوایەتێکی تر هاتووە عومەری کوری خەتاب هاتە لای پێغەمبەر گوتی: ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، ئایا ئێمە لەسەر حەق نین دوژمنەکانمان لەسەر ناڕەوا، ئەی بۆچی

---

[1]ـ البخاري ٩٦٧/٢

[2]ـ البخاري ١٤١١/٣ والبيهقي ٢/٩والنسائي ٤٦٣/٦ وابن أبي شيبة ٣٨٥/٧ وأحمد ٤٨٥/٣ وأبو يعلى ٣٦٥/١ والطبراني في الكبير ٩/٦ وأبو عوانة ٢٩٦/٤

سـووکایەتی بـە ئاینـەکـەمـان قبـوڵ بکـەیـن؟ پێغـەمبـەر فەرمووی: مـن پێغـەمبـەری خـوام سـەرپێچـی خـوا ناکـەم، ئـەو سـەرخـەرمـە[1]. لـە ریوایـەتـی تـر هـاتووە پێغـەمبـەر فەرمووی من پێغەمبەری خوام سـەرپێچـی پـەروەردگـارم ناکەم، ئەو یارمەتیدەرمە[2]، هەروەها گوتی: من پێغەمبەری خوام سەرپێچی ناکەم و ئیهمالم ناکات)[3].

ئاشکرایە لە هەندێک ریوایەت لەم چیرۆکەدا پێغـەمبـەر سـوور نـەبـووە لـەسـەر سـوڵحی حـودەیبیـە لـەسـەر یـەک بۆچوون، پێچەوانەی رای گشتی هـاوەڵانـی نـەکـردووە لـە چـەسـپاندنی رەئیـەکـەی بـەتـەنهـا، بـەڵکـو ئـەم کـارەی فەرمانێکی خوای بووە، ئەو بۆی نەبووە لێی لابدات، ئەو دەستەواژانەی هاتووە لە ریوایـەتـەکـان، وەک: سـەرپێچـی خـوا ناکـەم، مـن سـەرپێچـیم نـەکـردووە، بـۆ کـەسـێکی موسڵمان نابێت ـ چ جای پێغەمبەری کۆتا ـ کە سـەرپێچـی فەرمانی خوا بکات، لـەبـەر ڕەچاوکردنی هـەستی خـەڵک، یاخود سووربوون لەسەر ڕاوەرگرتن.

---

[1]ـ البخاري ٩٧٨/٢ والبيهقي في الكبرى ٩/ وعبد الرزاق ٣٣٩/٥وأحمد ٣٣/٤ والطبراني في الكبير ١٤/٢

[2]ـ ابن حبان ٤/١١

[3] ـ ابن أبي شيبة ٧|٣٨٨

حاڵـەتـی دووەم: کاتێـک پرۆسـەی ڕاگۆڕینـەوە کامـڵ بـوو، بۆچـوونی کـۆمەڵ جێگیربـوو لـەسـەر هـەڵبژاردنـی بژاردەیەکـــی دیـــاریکراو و بڕیـــار دەرچـــوو لـــە جێبـــەجێرکردنـــی ئـــەم هـــەڵبژاردنـــە، بـــەجۆرێـــک پاشـگەزبوونـەوەو دوودڵـی کـارێکی چـاوەڕوانکـراو نییـە، چـونکە ئەنجـامی لاوازی و شکـستی ریـزی مـسوڵمانان دەردەکـــەوێـت، دەکرێـت چیرۆکـی دەرچـوون بـۆ لای قـورەیـش بـۆ جـەنگی ئوحـود بکرێتـە نمونـەیـەک لێـرەدا پێغەمبەر بۆچوونی زۆرینـەی قبـوڵکرد لـە دەرچـوونی بـۆ ئوحود، هەرچەندە ئەمە بۆچوونی ئەو نەبـوو، بـەڵکو ئـەو پێی وابوو بمێننەوە و هەڵوێستی بەرگرییکردنیـان هەبێت لـە شـاری مـەدینـە، بـەڵام کاتێـک هـەنـدێک خـەڵـک لـە بۆچوونەکەي یەکەمجاریان پەشیمان بوونـەوە و داوایـان لە پێغەمبەر کرد بگەڕێنەوە بۆ هەڵوێستی یەکەم، ئـەویش قبوڵی نـەکـرد، چونکـە ئـەو دوودڵییـە سـەری دەکێشا بـۆ دەرکـــەوتنـــی لاوازی و نـــەبـــوونی توانـــا لـــەســـەر یەکلاکردنەوەی سـەرکردایـەتی پێغـەمبـەر، کـە لـەم شتانە نەشـیاو نیـیە بـۆ سـەرکـردەی سیاسـی و سـەربـازی سـەرکـەوتـوو لـە هـەرکـات و شـوێنێک بێـت، چ جـای بـۆ

پێغـەمبـەران (سـەلامـی خوایـان لـەسـەربێـت)، وەک لـە وەڵامدانەوەکەیدا هاتووە، کە فـەرموویـەتی: بـۆ پێغـەمبـەر ناکرێـت ئـەوەی پۆشـیویەتـی بـۆ ئـومەتەکەی لـەبـەری بکاتەوە، تا خوا بڕیاری خۆی دەدات[1]، لـە ریوایـەتێکی تـر هاتوو، ناکرێت پێغەمبەر ئەو شـتانە لـەخـۆی بکاتـەوە، کـە پۆشـیویەتـی تـا خـوای گـەورە حـوکم لـە نێـوان خـۆی و دوژمنەکەی دەکات[2].

لە ڕاستیدا سـووربوونی پێغـەمبـەر لـەسـەر دەرچـوون بۆ ئوحـود دوای بڕیـاردانی رەتکردنـەوەی رای زۆرینـەی هـاوەڵان نـەبووە، بـەڵکو پابـەندی بـووە بـەو بۆچوونـەی ئەوانیش بەشدارییان کردووە، هەروەها لەپێنـاو پاراسـتنی هێـز و سـامی موسـڵمانان بـووە لـە دڵـی دوژمنـەکانیانـدا، لەکاتێک ئاماژە هەبووە بە لاوازی شکست، کە ئەمـەش لـە جەنگدا کارێکە قەبوڵ نییە.

ئایـەتـی خـوای گـەورە (فـإذا عزمـت فتوکـل علـی اللـه)[3] هـەردوو حاڵـەتـەکـەی لـەخۆگرتـووە، یـەکیـان دەربـڕی

---

[1] ـ البخاري ٢٦٨٢/٦ و" اللأمة الدرع وجمعها لؤم... ومنها قيل: قد استلأم الرجل إذا لبسها فهو مستلئم" القاسم بن سلام: غريب الحديث ٤|٣٢٧

[2] ـ الحاكم ٢|١٤١ والبيهقي ٧|٤١

[3] ـ سورة آل عمران، الآية ١٥٩

قسەکەر (إذا عزمتُ)[1]، کە بۆ خوا دەگەڕێتەوە، لەوەدا گوێ بە قسەی کەس نادرێت، وەحی کارەکە یەکلادەکاتەوە.

هەروەک بە دەربڕی بەرامبەر هاتووە (فإذا عزمتَ)، فەتحەی (تا)کە، ئەوەش وا دەخوازێت کە بڕیاری کۆمەڵێک کاتێک جێگیربوو، ئەوکات سەرکردە بڕیارەکە دەدات، هیچ دەرفەت نییە بۆ پاشگەزبوونەوە، چونکە هەموو پاشگەزبوونەوەیەک لە کاتی جەنگ یەکسانە بە شکست و لاوازی لە کاتی یەکلاکردنەوەدا، ئەمە بریتییە لە بڕیاردان و روونکردنەوە، وەک لە ریوایەتی ئیمام بوخاریدا هاتووە، پێغەمبەر لە رۆژی حودەیبیە و ئوحود هەردوو قیرائەتەکەی جێبەجێکردوە.

ئیمام بوخاری زۆر جوان ئەوەی کردووە بە بابەتێکی فیقهي کە دەڵێت: (وأمرهم شورى بينهم)، (وشاورهم في الأمر)، راوێژکردن و ڕاگۆڕینەوە پێش بڕیاردان و روونکردنەوەیە، چونکە خوا دەفەرموێت: (فإذا عزمت فتوكل على الله)، کاتێک پێغەمبەر بڕیاریدا هیچ مرۆڤێک بۆی نییە قسەی خۆی بەسەر قسەی خوا و پێغەمبەر

---

[1] ـ تفسير البيضاوي ٣/١

بخات، پێغەمبەر لە ڕۆژی ئوحود ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد بۆ مانەوەو دەرچوو، ئەوان دەرچوونیان پێ باش بوو، دوای بڕیـــاری گوتیـــان بمێـــنەرەوە، بەڵام ئەو دوای بڕیارەکە بە قسەی نەکردن، ئینجا فەرمووی: ناکرێت پێغەمبەر کە جلی پۆشی ئیتر دایکەنێت تا خودا حوکمی خۆی دەکات.

هەروەها ڕاوێژی بە عەلی و ئوسامە کرد لە بابەتی بوختانی عائیشە، گوێی بۆ گرتن تا قورئان دابەزی و ئەو کەسانەی بوختانیان کردبوو جەڵدی لێدان، پێچەوانەی ڕایەکەی نەکردن، دوایی حوکمی بەوەکرد کە خوای گەورە فەرمانی پێکردبوو، پێشەوایان دوای پێغەمبەر ڕاوێژیـان بـە ئـەهلـی عـیلم دەکـرد لـەو کاروبارانـەی ڕێپێدراون بۆ ئەوەی ئاسانترینیان وەربگرن، بەڵام ئەگەر بابـەتێـک قورئـان وسـوننەت ڕوونـی کردبـۆوە، شـوێن پێغەمبەر دەکەوتن، ئەبوبەکر جەنگی ئەو کەسانەی پێ باش بوو کە زەکاتیان نەدەدا، عومەری کوڕی خەتاب گوتی: چۆن شەڕیان لەگەڵ بکەین کاتێک پێغەمبەر دەفەرموێت: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله فإذا قالوا لا إله إلا الله عصموا مني دماءهم وأموالهم

إلا بحقها وحساباهم على الله)، واتە: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵک بجەنگم تا دەڵێن: لا إله إلا الله کاتێک گوتیان: لا إله إلا الله خوێن ماڵیان لە من حەرام دەبێت و لێپرسینەوەیان لەسەر خوایە، ئەبوبەکر گوتی: من شەڕیان لەگەڵ دەکەم، چونکە ئەوەی پێغەمبەر پێکەوەی ئەنجامداوە ئەوان لەیەکیان جودا کردووەتەوە، ئەبوبەکر ئەگەر حوکمی پێغەمبەری لەلا بوایە راوێژی بە کەس نەدەکرد لەبارەی ئەو کەسانەی کە جیاوازییان کرد لە نێوان زەکات و نوێژ، ئەوان ویستان گۆڕانکاریی لە نێوان ئاین و حوکمە ئاینیەکان بکەن[1].

هەرچۆن بووبێت هاوەڵان سووربوون لەسەر جیاکاری لە نێوان وەحی خوای گەورە کە هیچ ڕێگایەک نییە بۆ دەرچوون لێی جگە لە ملکەچی، ئەمەش وەک عیبادەت و ملکەچبوون بۆ خودای گەورە و نێوان ئیجتهادەکانی پێغەمبەر، کە پەیوەستبوون بە ئەزموونی مرۆڤ لە ژیان، کە کارێکە دەخرێتە ژێر گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە، هاوەڵانیش موناقەشەیان کردووە، بۆچوونی خۆیان دەربڕیوە، کە هەندێک جار لە ڕاستی نزیکتر بووە

[1]ـ البخاري ٢٦٨٢/٦ وانظر أيضا ابن حجر: تغليق التعليق ٣٣/٥

له بابەتی سیاسی وسەربازی، هەرلەبەر ئەو جیاکارییە بووە سەرکردەکانی ئەنصاری پرسیاریان لێکرد، کاتێک کە رێکەوتنی بەنی غەتەفانی خستەڕوو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەوە وەحی ئاسمانە تەسلیم بە ئەمری خوا بین؟ یان رەئی خۆتە، بۆچوونی ئێمەش وەردەگریت؟ ئەگەر مەبەستت مانەوە و پارێزگارییە لە ئێمە، سوێند بەخوا ئێمە و ئەوان وەک ئەوین، ئەوان دەنکە خورمایەکیان لە ئێمە بە کڕین یان خێر نەبیت نەسەندووە[1].

پێشتریش حەبابی کوڕی مونزیر لە جەنگی بەدر پێی گوتبوو ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شوێنەی کە ئێمە لێی دانیشتووین خوای گەورە بۆی دەستنیشان کردوین، تا هیچ سەرپێچی نەکەین، یاخود بیروبۆچوون و جەنگ و تاکتیکە[2].

پێغەمبەری خوا ڕاگۆرینەوەی بەلاوە ئاسایی بوو کاتیک بۆی روون دەبۆوە کە لەبابەتی سەربازی و

---

[1] ـ الطبراني في الكبير ٦|٢٨ وأبو نعيم: معرفة الصحابة ٣|١٢٥١ وقال الهيثمي "ورجال البزار والطبراني فيهما محمد بن عمرو وحديثه حسن وبقية رجاله ثقات" انظر الهيثمي: مجمع الزوائد ومنبع الفوائد ٦|١٣٣

[2] ـ ابن هشام: السيرة النبوية ٣| ١٦٧ وابن حزم: جوامع السيرة ص ١١٢

سیاسی بۆچوونی ئەوانی تر دروستترە، هەروەک لە کاتی دابەزینی لە جەنگی بەدر و ڕێکەوتنی لەگەڵ غەتەفان لە ڕۆژی ئەحزاب ئەنجامیدا.

ئەنجامی جەنگی بەدر دەریخست کە ڕاکەی حەباب دروست لە بابەتی سەربازی، هەروەها کۆتایی بە شکستی هێزی ئەحزاب هات بەبێ ئەوەی زیان بە بەرهەمی خورمای ئەنصارییەکان بگات.

هەندێک لە زانایانی هاوچەرخ بۆچوونی تازەیان هەیە لەبارەی وەرگرتنی رەئی زۆرینە لە بابەتی شورا، کە دەڵێن ئەو رەئیەی زۆرینە حاکم ناچار دەکات پێوەی پابەند بێت، دەبێت دوولەسەر سێ بێت و نابێت کەمتر بێت، بەڵگەشیان بۆ ئەمە فەرموودەی ئیبن غەنەمی ئەشعەرییە، کە لە فەرموودەکە هاتووە: پێغەمبەر فەرموویەتی: بە ئەبوبەکر و عومەر ئەگەر ئێوە کۆبوون لەسەر ڕایەک لە راوێژێکدا سەرپێچیتان ناکەم[1]. لە هەموو بارێکدا ئەم فەرموودەیە لاوازە.

---

[1]ـ أحمد ٧/٤ وقال الهيثمي: "رجاله ثقات إلا أن ابن غنم لم يسمع من النبي صلى الله عليه وسلم" الهيثمي ٥٣/٩ كما ضعفه الألباني في "سلسلة الأحاديث الضعيفة" الحديث رقم ١٨.

ئەبوبەکر و عومەر ـ لە شیکاری ئەواندا ـ نوێنەرایەتی زۆینە دەکەن، کە سێیەکە، کاتیک لەگەڵ پێغەمبەرن، بەڵام ئەم بۆچوونە ـ لەگەڵ ناوازەیدا ـ هیچ بەربەست نییە لەوەی رای زۆرینە قبوڵ بکرێت با کەمتریش بێت لە دوولەسەر سێ، ئەگەر ئەهلی ئەم بۆچوونە وردتر سەرنجیان بدایە دەبینین کە وێنا ناکرێت دوو کەس کەمتر لە کۆی سێ کەس زۆرینەبن، ئەو دووە زۆرینەیەکی رەهایە، لەهەمان کات زۆرینەی سادەیشە.

ئەوەی ئێمە لە کۆی ئەو دەقانە حاڵی بووین کە سەیرمان کردووە لەبارەی پرسی سیاسی، شورا لە دوستکردنی دەسەڵات لە سەرەتاوە واجبە لە کۆتاییدا پابەندکارە وەک پێشتر باسمانکرد، بەڵام ڕاگۆڕینەوە وردەکاری تێدایە:

* راوێژکردن واجبە، ئەنجامەکەی پابەندییە لەو کارە گەورانەدا کە تایبەتمەندی حاکمی تێدا نییە، لەبەر مەترسی و کاریگەری لەسەر کۆی ئومەت، وەک راگەیاندنی جەنگ، بەستنی ئاشتی ...هتد بۆیە پێغەمبەر دابەزی بۆ بۆچوونی زۆرینە لە جەنگکردنی قورەیش لە ئوحوددا.

یاسای دەستوری هاوچەرخ لەو کارەی پێغەمبەرەوە سەرچاوەی گرتووە، کاتێک دەسەڵاتی جێبەجێکردن قەدەغە دەکات، کە ئەوبریارە چارەنووسسازانە بدات بەبێ رەزامەندی و پرسکردن بە گەل بەگشتی، ئەم بابەتە لە دەستوری هەموو وڵاتە دیموکراسیەکانی ئەمڕۆ دەقی قانونی لەسەرە.

لەو کاروبارانەی کە دەسەڵاتی حاکمی جێبەجێکار مافی هەیە، کە ناتوانێت بێ ئەوە جێبەجێی بکات وەک دامەزراندنی پیاوانی دەوڵەت و لادانیان، ئەوکاتە ڕاوێژکردن واجبە، بەڵام ئەنجامەکەی پێوەی پابەند نابێت، بەیعەتدانی ئومەت مافی دەستوەردانی داوەتێ لەوکارانە، ئومەتیش چاودێرە و هەڵەش بکات راستی دەکاتەوە، لارییش نییە پەیوەستی بکات بە هەندێک کار، کە گرنگیان هەیە، بۆ نموونە مافی ئەوەی هەیە وەزیرەکان و والی و سەرکردە سەربازییەکان بپاڵێوێت، پاشان پەرلەمان پەسندیان دەکات بەرلەجێبەکردنی، وەک لە هەندێ وڵاتی ئەمڕۆ بەم جۆرەیە، تا بڕیارەکە لەیەک کات پێکهاتەیەک بێت دەربڕی دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوا و چاودێری ئومەتیش بێت.

* لـە پرسـە کـەسـییەکـان کە تـاک بـەرپرسـیاریێتی و ئـەنجامـەکـەی هـەڵـدەگرێـت، ڕاوێژکـردن واجـب نییـە، ئەنجامـەکـەش کـەس پابـەند ناکـات، وەک پابـەندییـەک بـە پێغەمبەری خوا کە لە هـەندێک کاروبـاری خێزانـی راوێـژ بـە نزیکـەکـان بکرێـت، وەک پێغـەمبـەر راوێـژی بـە عـەلـی کـوڕی ئـەبـو تالیـب و ئوسـامـەی کـوڕی زەیـد کـرد، ڕاوێژکردن بەم مانایە لە بازنەی دروستکردنی دەسەڵات و جێبەجێکاری دەردەچێت، ئەوکاتە کارێکی سیاسی نییـە، بـەڵکو حیکمـەتێکی ئـەخلاقیـە، سـود بـەتـاک دەگـەیـنێت لـە ژیانی تاکەکەسی.

**چەند نمونەیەک لە راوێژەکانی پێغەمبەر:**

پێغەمبەری خوا ڕاوێژی زۆری دەکرد، تەنـانەت ئـەبـو هورەیرە ریوایەتکراوە، کە گوتوویەتی: هیچ کەسم نەدیوە بەئەندازەی پێغەمبەر راوێژ بکات بە هاوەڵەکانی[1].

لە راوێژکردنەکانی پێغەمبەر بە هاوەڵانی، ئەمـە چـەند نمونەیەکە نەک هەموو نمونەکان:

---

[1] ـ سنن الترمذي ٢١٣/٤ونحوه في سنن البيهقي الكبرى ٢١٨/٩ ومصنف عبد الرزاق ٣٣١/٥ ومسند أحمد ٣٢٨/٤ وقال الحافظ ابن حجر في فتح الباري ٣٤/١٣: "رجاله ثقات إلا أنه منقطع" وقال ابن كثير في إرشاد الفقيه ٣٨٧/٢: "فيه انقطاع".

یەکەم: ڕاوێژکردنی بە ئەنصارییەکان لە جەنگی ڕۆژی بەدر: لە ئەنەسی کوڕی مالیک گێردراوەتەوە، کە لەوکاتەی ڕۆیی بۆ بەدر راوێژی بە موسڵمانان کرد، بە ئەبوبەکر وەڵامی ڕاوێژەکەی دایەوە، دواتر راوێژی پێکردنەوە و عومەر وەڵامی دایەوە، پاشان راوێژی پێکردنەوە، ئەنصارییەکان گوتیان: بانگیان کرد، ئەی هۆزی ئەنصار پێغەمبەر ئێوەی دەوێت، ئامان پێغەمبەر ئێوەی دەوێت، وەڵامیان دایەوە، کەواتە ئێمە وەک بەنی ئیسرائیل ناڵێین موسا، تۆ و خواکەت برۆن شەڕ بکەن ئێمە لێرە دادەنیشین، سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە، ئەگەر بۆ ناوجەرگەی (برک الغماد) بڕۆی شوێنت دەکەوین[1].

لە ریوایەتێکی تر هاتووە، پێغەمبەر ڕاوێژی بە موسڵمانان کرد، ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە، جا بێدەنگ بوو، پاشان راوێژی کردەوە و عومەر وەڵامی دایەوە، دووبارە بێدەنگ بوو، پیاوێک لە ئەنصارییەکان هەڵساوە

[1] ـ البيهقي في الكبرى ١٩/١ والنسائي ٩٢/٥ وأحمد ١٥/٣ وصحح إسناده الذهبي في المهذب ٤٩٨/٨ والألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الحديث رقم ٣٣٤.

گوتی: ئێوەی دەوێت، لە ریوایەتێکی تر هاتووە:[1] پێغەمبەر کاتێک بیستی ئەبو سوفیان گەیشت راوێژی کرد، ئەبوو بەکر قسەی کرد پێغەمبەر پشتی تێکرد، عومەر قسەی کرد پشتی تێکرد، سەعدی کوڕی عوبادە هەڵساوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمەت دەوێت ئەگەر فەرمان بکەی خۆمان بە دەریادا بکەین دەیکەین، وە ئەمر بکەیت بچنە ناوجەرگەی (برک الغماد)ەوە دەچین[2]، یەکێک لە ئەنصارییەکان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا راوێژ بە ئێمە دەکەیت،[3] ئەنصارییەکان گوتیان: جگە لە ئێمە کەسی تری مەبەست نییە[4].

دووەم: راوێژکردنی لە دیلەکانی بەدر، ئایا بکوژرێن، یان فیدیەیان لێ وەربگیرێت، لەوکاتەی دیلەکان گیران، راوێژی بە ئەبوبەکر و عومەر کرد، چی دەڵێن: لەبارەی ئەو دیلانە؟ ئەبوبەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە ئامۆزا و عەشیرەتن پێم باشە فیدیەیان لێ وەربگریت، کە

---

[1] ـ أبو يعلى٦/٤٧ وقال الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الحديث رقم ٣٣٤: "صحيح على شرط الشيخين"

[2] ـ مسلم، الحديث رقم ١٧٧٩، وأحمد ٣/٢٥٧

[3]ـ أحمد ٣/١٨٨

[4]ـ ابن حبان ١١/٢٣